# دوعاو ئەذكارو ئاداب
# بۆ
# منداڵان
# لە سوننەتی صەحیحی
# پێغەمبەرمان ﷺ

کۆکردنەوەو ئامادەکردنی

**م. صلاح الدين عبدالكريم**

٢٠٠٩ز / ١٤٣٠ک

چاپی یەکەم

# پێناسەی پەرتووك

ناوی پەرتووك: دوعاو ئەذکارو ئاداب بۆ منداڵان لە سوننەتی صەحیحی پێغەمبەرمانﷺ.

ناوی کۆکەرەوەو ئامادەکار: م. صلاح الدين عبد الكريم .

ژمارەی سپاردن: ژمارە ( ٣٤٦ ) پێ دراوە لە لایەن وەزارەتی ڕۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە .

زنجیرە: زنجیرەی ( ) لە زنجیرە ڕێنماییەکانی ڕێگای ڕاست.

نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم - ( ١٤٣٠ ك / ٢٠٠٩ز) .

چاپخانە: سیڤا / سلێمانی .

تیراژ: (١٠٠٠).

بنکەی بڵاوکردنەوە: کتێبخانەی سیما / چەمچەماڵ .
کتێبخانەی سوننە / سلێمانی.
کتێبخانەی زانست/ کەلار.



## ناوەڕۆك

| لاپەڕە | بابەت |
|---|---|
| ٥ | پێشەکی |
| ٧ | دوعای نوستن |
| ٨ | ئادابی نوستن |
| ٩ | دوعای لە خەو هەستان |
| ١٠ | دوعای چونە سەر ئاو |
| ١٠ | ئادابی چوونە سەر ئاو |
| ١٢ | دوعای هاتنە دەرەوە لەسەر ئاو |
| ١٣ | دوعای پۆشاك پۆشین ( جل وبەرگ لەبەر کردن ) |
| ١٣ | ئادابی پۆشاك پۆشین |
| ١٤ | دوعای لەبەر کردنی پۆشاکی نوێ |
| ١٥ | دوعا کردن بۆ کەسێك کە پۆشاکی نوێ لەبەر بکات |
| ١٥ | ئادابی جل داکەندن |
| ١٦ | ئادابی نان خواردن |
| ١٨ | دوعای دەست هەڵگرتن لە خواردن |
| ١٩ | ئادابی خواردنەوە |
| ٢١ | ئادابی سەردانی کردن |
| ٢٢ | ئادابی سەلام کردن |
| ٢٤ | ئادابی گاڵتە کردن |
| ٢٥ | دوعای دەرچوون لە ماڵ |
| ٢٦ | چوونە ماڵەوە |
| ٢٧ | ئادابی سەردانی کردنی نەخۆش |

| | |
|---|---|
| ئادابی ڕێگاوبان | ٢٩ |
| ئادابی پژمین | ٣٠ |
| ئادابی باوێشك | ٣١ |
| ئادابی بەكارهێنانی تەلەفۆن | ٣٢ |
| ئەدەب لەگەڵ دایك وباوكدا | ٣٣ |
| دوعای چوونە مزگەوت | ٣٤ |
| ئادابی چوونە مزگەوت | ٣٥ |
| دوعای هاتنە دەرەوە لە مزگەوت | ٣٦ |
| ئادابی قوتابخانە | ٣٧ |
| دوعای سوار بوونی ئۆتۆمبیل | ٣٨ |
| ئادابی چەژنەكان | ٤١ |
| سەرسام بوون بە شتێكی جوان | ٤٢ |
| لە كاتی ڕوودانی شتێك كە پێت خۆش بێت | ٤٣ |
| لە كاتی ڕوودانی شتێك كە حەزی پێ ناكەیت | ٤٤ |
| لە كاتی بیستنی هەورە بروسكە | ٤٥ |
| لەكاتی هەڵكردنی بادا | ٤٦ |
| لە كاتی بێ بارانیدا | ٤٦ |
| لە كاتی باران بارینداا | ٤٦ |
| لە پاش باران بارین | ٤٧ |
| لە كاتی بینینی مانگ | ٤٨ |
| لە كاتی بیستنی وەڕینی سەگ وزەڕینی كەر بەشەو | ٤٩ |
| لە كاتی بیستنی دەنگی كەڵەشێر | ٤٩ |

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەكی

إِنَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِيْنُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوْذُ بِاللهِ مِن شُرُوْرِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ .

وَأَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيْكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُوْلُهُ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ (آل عمران: ١٠٢).

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴿١﴾ ﴾ (النساء: ١).

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾ (الأحزاب: ٧٠-٧١).

أَمَّا بَعْدُ ...

فَإِنَّ أَصْدَقَ الحَدِيْثِ كِتَابُ اللهِ وَخَيْرَ الهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ) وَشَرَّ الأُمُوْرِ مُحْدَثَاتُهَا وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ وَكُلَّ ضَلالَةٍ فِي النَّارِ .

خوای گەورە فەزڵ وچاکەو بەخششی زۆری بەسەر خەڵکییەوە هەیە بەگشتی، وەبەسەر باوەڕداران بەتایبەتی، وەگەورەترین بەخشش وچاکەی خوای گەورە بەسەرمانەوە بە رەهایی بریتییە لە هیدایەت دانمان بۆ ئەم ئایینە بەرز وپیرۆزە، کە بەهۆیەوە لە تاریکییەکانی کوفرو شیرك وبیدعەو تاوان رزگارمان بووە بۆ روناکی ئیسلام وئیمانو سوننەتو قورئان، وەیەکێکی تر لە بەخششەکانی خوای گەورە بەسەرمانەوە بریتییە لە بەخشینی منداڵ، کە هەرکەسێك خوای گەورە منداڵی پێبەخشی پێویستە لەسەری بەگوێرەی رێنماییو یاسای ئەو خوایەپەروەردەی بکات کەپێی بەخشیوە تا لە دوارۆژدا منداڵێکی صاڵحی لێدەرچێتو دایكو باوکی بحەسێنێتەوەو سودبەخش بێت بۆ دینو گەلو وولأتەکەی،وە ئەم نامیلکەیەی بەردەستت هەوڵێکە بۆ پەروەردەکردنی مندالأنمان پەروەردەیەکی راستو دروست، کە تێیدا چەندەها زیکرو دوعاو ئادابی جوان باسکراوە، وەهەوڵم داوە هەموو فەرموودەکان صەحیح بنو دوور بن لە فەرموودەی لاوازو هەڵبەستراو، هەربۆیە ناوم نا دوعاو ئەزکارو ئاداب بۆ مندالأن لە سوننەتی صەحیحی پێغەمبەرمانﷺ، بە ئومێدی ئەوەی کە سود بە مندالأن بگەیەنێت وتەنها لەبەر رەزامەندی خوای گەورە بێت .

وصلى الله وسلم على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين .

**ئامادەکار**

**٨/جمادی الأولی/ ١٤٣٠ك**

**بەرامبەر٣/٥/٢٠٠٩**

# دوعای نوستن

(باسمك ربي وضعت جنبي وبك أرفعه، إن أمسكت نفسي فارحمها، وإن أرسلتها فاحفظها بما تحفظ به عبادك الصالحين)[١].

واتە: بەناوی تۆوە ئەی پەروەردگارم لایەکانم دانا، وەهەر بەناوی تۆوە بەرزی دەکەمەوە، ئەگەر گیانمت کێشا ئەوا بەبەزەیی بە لەگەڵیدا، وە ئەگەر بۆمت گەڕاندەوە ئەوا بیپارێزە بەو شتەی کە بەندە چاکەکانتی پێ دەپارێزیت.

(باسمك اللهم أموت وأحيا)[٢].

واتە: بە ناوی تۆوە ئەی پەروەردگارم دەمرم ودەژیم (دەخەوم وهەڵدەستم).



(١) (صحيح الجامع الصغير: ٤٠٧).

(٢) (صحيح الأدب المفرد: ١٢٠٥).

# ئادابی نوستن

١- جێگای نوستنەکەی دەتەکێنێت، چونکە نازانێت چی لە ژێردایە، بەتایبەتی ئەگەر لە گوند ودەشت خەوت.

٢- لەسەر لای راستی دەخەوێت ودەستی راستی دەخاتە ژێر روومەتی .

٣- بە دەست نوێژەوە دەخەوێت.

٤- لەسەر سکی نانوێت، چونکە خوای گەورە رقی لەم جۆرە نوستنەیە.

٥- خوێندنی ئایەت ئەلکورسی پێش نوستن.

٦- خوێندنی (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) و(قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ) و(قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ) سێ جار.

٧- زوو نوستن بۆ زوو لە خەو هەستان.

# دوعای لە خەو هەستان

(الحمد لله الذي أحيانا بعد ما أماتنا وإليه النشور)[٣].

واتە: حەمدو سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە زیندومانی کردەوە لە پاش ئەوەی کە مرانمانی، وە گەڕانەوەیش هەر بۆ لای ئەوە.

١- سوپاس کردنی خوای گەورە لەسەر گەڕانەوەی روحمان.

٢- شوشتنی دەست ودەم وچاو .



(٣) (صحيح الجامع الصغير: ٤٦٥٠).

## دوعای چوونە سەر ئاو

(بسم الله اللهم إني أعوذ بك من الخبث والخبائث)(٤).



## ئادابی چوونە سەر ئاو

واتە: بەناوی خواوە، خوایە من پەنا دەگرم بە تۆ لە شەیتانی نێرو مێ.

١- پێش خستنی پێی چەپ لە کاتی چونە سەر ئاو.

٢- روو و پشت نەکردنە قیبلە لەسەر ئاو.

٣- خۆ پاك نەکردنەوە بە دەستی راست.

---

(٤) (صحيح الجامع الصغير: ٤٧١٤).

٤- خۆ پاك كردنەوە بە باشی بەدەستی چەپ.

٥- خۆ پاراستن لە بەركەوتنی پریشك.

٦- قسە نەكردن لەسەر ئاو.

٧- هەڵنەگرتنی شتی پیرۆز لە كاتی چونە سەر ئاو (ناوی خوا، ناوی پێغەمبەرﷺ، ئایەت، فەرموودە.........).

٨- وەڵام نەدانەوەی سەلام لەسەر ئاو.

٩- پاك كردنەوەی پاشەڕۆ لەپاش هاتنە دەرەوە لەسەر ئاو.

١٠- ئەگەر لە دەشت بوو ئەوا دور دەكەوێتەوە تا كەس نەیبینێت.

١١- ئەگەر دەشت بوو ئەوا نابێت میزو پیسی بكاتە ناو ئاو، یاخود ژێر دارو سێبەرێك كە شوێنی پشوو حەوانەوەی خەڵك بێت، یاخود سەر رێگای خەڵكی.

١٢- ئەگەر ئاو نەبوو بە سێ بەرد خۆی پاك دەكاتەوە، یاخود دەسەسڕ.

# دوعای هاتنە دەرەوە لەسەر ئاو

پێی راست پێش دەخەیت لە کاتی هاتنە دەرەوە لە سەر ئاو و دەڵێیت: (غفرانك)(٥).

واتە: خوایە داوای لێخۆش بوونت لێ دەکەم.



(٥) (صحيح الجامع الصغير: ٤٧٠٧).

# دوعای پۆشاك پۆشین (جل وبەرگ لەبەر كردن)

(الحمد لله الذي كساني هذا ورزقنيه من غير حول مني ولا قوة)[٦].

واتە: حەمدو سوپاس بۆ ئەو خوایەی كە ئەم پۆشاكەی پێ بەخشیم بە بێ هیچ هەوڵ وهێزێكەوە لە منەوە.



# ئادابی پۆشاك پۆشین

١- سوپاس كردنی خوای گەورە لەسەر بەخشینی ئەو پۆشاكە.

٢- لای راست پێش دەخەیت لە كاتی لەبەر كردنی پۆشاكدا.

٣- لە شوێنێك خۆت دەگۆڕیت كە كەس نەتبینێت.

(٦) (صحيح الجامع الصغير: ٦٠٨٦).

٤- پۆشـاكێك ناپۆشـیت كـە بـۆ فیـزو خـۆ بەگـەورە زانـین وناوبـانگ دەركردن بێت.

٥- پۆشاكێك ناپۆشیت كە وێنەو خاچی لەسەر بێت.

٦- پۆشـاكێك ناپۆشـیت كـە پۆشـاكی موسـڵمانان نـەبێت ولاسـایی كردنەوەی بێباوەڕان بێت.

٧- كوڕ پۆشاكی كچ ناپۆشێت وكچیش پۆشاكی كوڕ ناپۆشێت.

٨- كوڕ پۆشاكی ئاوریشم لەبەر ناكات.

٩- پۆشاكی كچ دەبێت ئەستور وفراوان ودرێژ بێت.

١٠- نابێت كوڕ پۆشاكی لە خوار قولە پێی (كعب) درێژ تر بێت.

١١- هەركەسێك ئەو دوعایەی سەرەوە بخوێنێت لـە كـاتی جـل وبـەرگ لەبەركردندا خوای گەورە لە تاوانەكانی پێشوی خۆش دەبێت.

## دوعای لەبەر كردنی پۆشاكی نوێ

(اللهم لك الحمد أنت كسوتنيه أسألك من خيره وخير ما صنع له وأعوذ بك من شره وشر ما صنع له)[٧].

واتە: خوایە حەمدو سوپاس بۆ تۆ كە ئەم پۆشـاكەت پـێ بەخشـیوم، داوای خێرو چاكەیت لێ دەكەم وئەو خێرو چاكەی كە بۆی دروست كراوە، وە پـەنا دەگرم بە تۆ لە شەڕو خراپەی وئەو شەڕو خراپەی كە بۆی دروست كراوە.

---

(٧) (صحيح الجامع الصغير: ٤٦٦٤).

# دوعا كردن بۆ كەسێك كە پۆشاكی نوێ لەبەر بكات

البس جديدا وعش حميدا ومت شهيدا[٨].

واتە: هەر پۆشاكی تازە لەبەر بكەیت وهەر بە خۆشی بژیت وبە شەهیدی لە پێناوی خوادا بمریت.

# ئادابی جل داكەندن

(بسم الله)[٩].

١- پێشخستنی لای چەپ لە جل داكەندن لەبەر.

٢- هەڵواسینی جل وبەرگ لە شوێنێكی پاك وخاوێن.

٣- لە شوێنێكی چۆڵ جلەكانت دەداكەنیت كە كەس نەتبینێت.

٤- هەركەسێك لە كاتی جل داكەندندا بڵێت: بسم الله ئەوا جنی عەورەتی نابینێت.



(٨) (صحيح سنن ابن ماجة: ٣٥٥٨).

(٩) (صحيح الجامع الصغير: ٣٦١٠).

# ئادابی نان خواردن

١- دەست شۆرین لە پێش نان خواردن.

٢- ووتنی (بسم الله) لەسەرەتای نان خواردن.

٣- ئەگەر لە سەرەتا لە بیری کرد ئەوا با لە کاتی نان خواردن با بلێت: (بسم الله أوله وآخره)[١٠].

واتە: بەناوی خوا لەسەرەتاو کۆتاییدا.

٤- بەدەستی راستی بخوات.

٥- لە بەردەستی خۆی بخوات

٦- پەلە نەکردن لە کاتی نان خواردن.

٧- مام ناوەندی لە خواردندا (نە زۆر بخوات نەکەم).

٨- رەخنەو توانج نەگرتن لە خواردن، ئەگەر حەزی لێ بوو بیخوات ئەگەر نا با بێ دەنگ بێت.

٩- نەخواردنی خواردن بە گەرمی، چاوەڕێ بکەیت تا سارد دەبێتەوە.

١٠- دانیشتن بە شێوازێکی جوان بۆ نان خواردن، ونان نەخواردن بە پاڵ کەوتنەوە.

١١- نەکۆکین ونە پژمینە ناو خواردن.

١٢-ئەگەر میوان بوویت لە خۆتەوە دەست نەکەیت بە نان خواردن، بەڵکو پێویستە چاوەڕوان بیت تا خاوەن ماڵ فەرمووت لێ دەکات.

---

(١٠) (صحيح الجامع الصغير: ١٣٢٣).

١٣- ئەگەر میوان بوویت ئەوا ئەم دوعایە بۆ خاوەن ماڵ دەكەیت: (اللهم بارك لهم فيما رزقتهم واغفر لهم وارحمهم)[١١].

واتە: خوایە فەڕو بەرەكەت بخەیتە ئەو ڕۆزییەی كە پێت داون، وەلێیان خۆش بەو ڕەحمیان پێبكە.

١٤- پێویستە خاوەن ماڵ قسەی بەسود بۆ میوان بكات تا شەرم نەكات.

١٥- خاوەن ماڵ سەیری دەمی میوان نەكات تا شەرم نەكات.



(١١) (صحيح سنن أبي داود: ٣٧٢٩).

# دوعای دەست هەڵگرتن لە خواردن

(الحمد لله الذي أطعمني هذا الطعام ورزقنيه من غير حول مني ولا قوة)[١٢].

واتە: حەمدو سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ئەم خواردنەی پێ بەخشیم بەبێ هیچ هەوڵ وهێزێك لە منەوە.

١- سوپاس کردنی خوای گەورە لەسەر بەخشینی نیعمەتەکانی.

٢- سوپاس کردن ودوعای خێر کردن بۆ ئەو کەسەی کە خواردنەکەی بۆ ئامادە کردووین.

٣- شوشتنی دەست ودەم لە پاش نان خواردن.

٤- یارمەتی دانی دایك وبەردەست کردنی.

٥- زۆر نەمانەوە لە پاش نان خواردن ئەگەر میوان بوویت.

٦- هەرکەسێك لەپاش نان خواردن ئەو دوعایەی سەرەوە بخوێنێت ئەوا خوای گەورە لە تاوانەکانی پێشوی خۆش دەبێت.



(١٢) (صحيح الترغيب والترهيب: ٢١٦٤).

# ئادابی خواردنەوە

١- ووتنی **بسم الله** پێش خواردنەوە.

٢- خواردنەوە بە دەستی ڕاست.

٣- خواردنەوە بە دانیشتنەوە.

٤- خواردنەوە بە سێ قوم.

٥- ئەگەر گەرم بوو بە فوو سارد نەکرێتەوە.

٦- نەخواردنەوە لە دەمی دۆلکەوە.

٧- دەرنەبڕینی دەنگ لە کاتی خواردنەوەدا.

٨- نەخواردنەوە لە پیاڵەو گلاسی زێڕو زیو.

٩- وتنی الحمد لله لە کۆتاییدا.

١٠- ئەگەر خواردنەوەت دابەش کرد لە لای ڕاستەوە دەست پێ بکە.

١١- وە بەدەستی ڕاست دابەشی بکە.

١٢- ئەگەر خواردنەوەت دابەش کرد با خۆت دوا کەس بیت کە دەیخۆیتەوە.

١٣- ئەگەر کەسێك خواردنەوەی پێ دایت ئەوا ئەم دوعایەی بۆ بکە: (اللهم أطعم من أطعمني، واسق من سقاني)[١٣] .

واتە: خوا خواردن ببەخشە بەو کەسەی کە خواردنی پێ دام، وە خواردنەوەیش ببەخشە بەو کەسەی کە خواردنەوەی پێدام.

---

(١٣) (مسلم: ٣/١٢٦).

# ئادابی سەردانی کردن

١- سەردانی نەکردن بە بێ دیاری کردنی کات .

٢- دیاری کردنی کاتێکی گونجاو (کاتی پشو وحەوانەوە نەبێت).



٣- لە دەرگا یان لە زەنگ دان سێ جار وچاوەڕوان کردن لە نێوانیاندا.

٤- رانەوەستان لە بەرامبەر دەرگاکە، بەڵکو راوەستان لە لایەکی‌یەوە.

٥- ئەگەر وەڵامیان نەدایەوە بگەڕێرەوە.

٦- ئەگەر وترا: کێیە؟ نەڵێیت: منم یان خۆمانین، بەڵکو ناوی خۆت بڵێ.

٧- سەلام بکەو روخسەت وەربگرە بۆ چوونە ژوورەوە.

٨- لەو شوێنە دابنیشە کە خاوەن ماڵ بۆت دەستنیشان دەکات.

٩- ئەگەر وترا: کاتمان نییە یان گونجاو نییە، ئەوا بەلاتەوە ئاسایی بێت وبگەڕێرەوە.

## ئادابی سەلام کردن

١- سەلام کردن هۆکارێکە بۆ بڵاوبوونەوەی خۆشەویستی.

٢- سەلام کردن هۆکارێکە بۆ چونە بەهەشت.

٣- سەلام کردن بە ووتنی: (السلام عليكم ورحمة الله وبركاته).

٤- هەرکەسێك بەم شێوازە سەلام بکات سی(٣٠) خێری بۆ دەنوسرێت.

٥- وەڵام دانەوەی بە ووتنی: (وعليكم السلام ورحمة الله وبركاته).

٦- سواری سەلام لە پیادە دەکات.

٧- پیادە سەلام لە دانیشتوو دەکات.

٨- کەم سەلام لە زۆر دەکات.

٩- بچوك سەلام لە گەورە دەكات.

١٠-بە رووی خۆشەوە سەلام لە یەكتری دەكرێت.

١١-تەوقە كردن هۆكارە بۆ سڕینەوەی تاوان.

١٢- كوڕ تەوقە لەگەڵ كچی نامەحرەمدا ناكات وبە پێچەوانەوە.



# ئادابی گاڵتە کردن

١- با گاڵتە کردنت راست بێت ودرۆی تێدا نەبێت.

٢- ئەگەر پێویستی بە پێکەنین کرد ئەوا دەنگ بەرز مەکەرەوەو بە قاقا پێ مەکەنە، بەڵکو با پێکەنینت زەردە خەنە بێت.

٣- با گاڵتە کردنت لەگەڵ هاوتەمەنی خۆتدا بێت.

٤- با گاڵتە کردنت ئازاردان وتانەو تەشەری کەسی تێدا نەبێت.

٥- با گاڵتە کردنت زۆر نەبێت ولە سنور دەرنەچێت.

# دوعای دەرچوون لە ماڵ

بسم الله توكلت على الله لا حول ولا قوة إلا بالله[١٤].

واتە: بە ناوی خواوە، پشتم بە خوا بەست، وە هیچ هەوڵ وهێزێك نییە ئیللا بە پشت بەستن بە خواوە نەبێت.

هەركەسێك لە ماڵ دەرچێت وئەم دوعایە بخوێنێت ئەوا پێی دەوترێت: ئەمەت بەسەو پارێزرایت وشەیتانیشی لێ دوور دەكەوێتەوە.



(١٤) (صحيح الجامع الصغير: ٤٩٩).

# چوونە ماڵەوە

بسم الله.



# ئادابی سەردانی کردنی نەخۆش

لا بأس طهور إن شاء الله[١٥].

واتە: ئاساییە و بە ویستی خوا پاککەرەوەیە لە تاوان.

١- هەر موسڵمانێك سەردانی موسڵمانێکی نەخۆش بکات بۆ خوا ئەوا حەفتا هەزار فریشتە دوعای خێری بۆ دەکەن.

٢- پێویستە لای نەخۆش زۆر دانەنیشین، چونکە لەوانەیە پێویستی بە نوستن وپشو بێت.



٣- پرسیار لە نەخۆشەکە دەکەین سەبارەت بە نەخۆشییەکەی.

٤- هانی دەدەین کە گەشبین بێت و ورەی بەرز دەکەینەوە.

٥- یادی دەخەینەوە کە نەخۆشی دەبێتە هۆی سڕینەوەی تاوان.

---

(١٥) (صحيح الجامع الصغير: ٤٧١٨).

٦- هانی دەدەین کە ئارامگرو سوپاسگوزار بێت.

٧- یادی دەخەینەوە کە ئەگەر خوای گەورە کەسێکی خۆش بوێت نەخۆشی دەخات.

٨- دوعای خێرو شیفای بۆ دەکەین لە خوای گەورە.

٩- سورەتی (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) و(قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ) و(قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ)و (الفاتحة) ی بەسەردا دەخوێنین.

١٠- حەوت جار ئەم دوعایەی بەسەردا دەخوێنین:

(أسأل الله العظيم رب العرش العظيم أن يشفيك)(١٦).

واتە: داواکارم لە خوای گەورە پەروەردگاری عەرشی گەورە کە شیفات بدات.

---

(١٦) (صحيح الجامع الصغير: ٦٣٨٨).

# ئادابی ڕێگاوبان

١- ڕۆیشتن بە ڕێگادا بە شێوەیەکی مام ناوەند (نـە زۆر خێـراو نـە زۆر هێواش).

٢- ڕۆیشتن بەسەر زەوی بە خۆبەکەم زانین، بە بێ فیزو شانازی کـردن بەسەر خەڵکیدا.

٣- یاری نەکردن لـە ڕێگاوبـان وشـەقامەکاندا، تـا پشـو لـە خـەڵك تێـك نەدەین وئازاریان نەدەین.

٤- دانەنیشتن لەسەر ڕێگاو بان.

٥- پاراستنی دەست و دەم وچاو لە حەرام.

٦- پارێزگاری کردن لەسەر پاك وخاوێنی شەقام وڕێگاوبان.

٧- لابردنی هەر شتێك کە ئازار بە موسڵمانان دەگەیەنێت لە ڕێگاوبان.

٨- سەلام کردن و وەڵام دانەوەی سەلام.

٩- ڕێنمایی کردنی نابینا ونەشارەزا.

١٠-یارمەتی دانی هەرکەسێك پێویستی بە یارمەتی بێت.

# ئادابی پژمین

١- ئەگەر موسڵمان پژمی پێویستە لەسەری کە دەسەسرێك بخاتە سەر دەمی تا ئازاری کەس نەدات.

٢- پێویستە لە کاتی پژمیندا رووی خۆی وەرگێڕێت لە خەڵکی.

٣- وەئەگەر لەسەر خوان بوو رووی خۆی وەرگێڕێت لە خواردنەکە.

٤- لە پاش پژمین سوپاسی خوای گەورە بکات وبڵێت: **الحمد لله**.

٥- هەرکەسێك گوێی لێ بوو پێی بڵێت: **يرحمك الله**.

٦- ئەویش وەڵامیان بداتەوەو پێیان بڵێت:
**يهديك الله ويصلح بالك**[١٧].

٧- ئەگەر پژمینەکە چەند جارێك دووبارە بووەوە بە هۆی هەڵامەت (پەسیو) ئەوا هیچی پێ نالێیت.



(١٧) (صحيح الأدب المفرد: ٩٢١).

# ئادابی باوێشك

١- خـوای گـەورە باوێشـكی پـێ ناخۆشـە، چـونكە لـە شـەیتانەوەیەو نیشانەی تەمەڵی وبێزارییە.

٢- ئەگەر كەسێك باوێشكی هات چەندێك دەتوانێت با بیگەڕێنێتەوە.

٣- ئەگەر نەیتوانی بیگەڕێنێتـەوە ئـەوا بـا پشـتی دەسـتی چـەپی یـان ناولەپی دەستی راستی بخاتە سەر دەمی.



# ئادابی بەکارهێنانی تەلەفۆن

١– بەکار نەهێنانی تەلەفۆن بۆ جگە لە پێویست.

٢– بەکارنەهێنانی تەلەفۆن بۆ گاڵتە کردن بە خەڵکی وبێزار کردنیان.

٣– قسە زۆر درێژ نەکەینەوە لە تەلەفۆندا.

٤– پەیوەندی نەکەیت بەکەسەوە لەکاتی ناگونجاودا (وەکو بەیانی زوو، پاش نیوەڕۆ، شەوی درەنگ).

٥– ئەگەر تۆ زەنگت بۆ کەسێك کرد ئەوا بە (السلام علیکم) دەست پێ بکە.

٦– ئەگەر زەنگ کرا ئەوا بە بەڵێ وەڵام بدەرەوە.



# ئەدەب لەگەڵ دایك وباوكدا

١- گوێڕایەڵی كردنیان ولە قسە دەرنەچونیان.

٢- دەنگ بەرز نەكردنەوە بەسەریاندا.

٣- چاكە كردن لەگەڵیاندا.

٤- بێزار نەبوون لێیان وئۆف نەكردن لەبەرامبەریاندا.

٥- دوعای خێر كردن بۆیان و داوای لێخۆش بوون كردن بۆیان.

٦- لە پاش مردنیان جێ بەجێ كردنی وەسێت وئامۆژگارییەكانیان ئەگەر تاوانی تێدا نەبوو.

٧- سەردانی كردنی دۆست وهاوڕێیانیان.

٨- یارمەتیدانیان لە كارەكانیان.

# دوعای چوونە مزگەوت

**بسم الله والسلام على رسول الله اللهم اغفر لي ذنوبي وافتح لي أبواب رحمتك**[١٨].

**واتە: بەناوی خواوە، سەڵات وسەلام لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ، خوایە لە تاوانەکانم خۆش بە، وە دەرگاکانی سۆزو بەزەیی خۆتم لێ بکەرەوە.**




(١٨) (صحيح الجامع الصغير: ٤٧١٦).

# ئادابی چوونە مزگەوت

١- پێی راست پێش دەخەیت لـە چـونە نـاو مزگـەوت و ئـەو دوعایـەی سەرەوە دەخوێنیت.

٢- پـێش دانیشـتن لـە مزگـەوت دوو رکـات نوێـژی (تحیـە المسـجد) دەکەیت.

٣- هێمنی وئارامی مزگەوت دەپارێزیت.

٤- تف ناکەیتە ناو مزگەوت وپاك وخاوێنی دەپارێزیت.

٥- نەخواردنی سیرو پیاز پێش چوون بۆ مزگەوت.

٦- بۆن لە خۆدان پێش چوون بۆ مزگەوت.

٧- بە پۆشاکی پاك وخاوێنەوە دەچین بۆ مزگەوت.

٨- لە کاتی وتاردا قسە ناکەین وبێ دەنگ دەبین وگوێ لـە وتارەکـە دەگرین.

٩- ناچینە نێوان دووکەسەوە وبەسەر شانی خەڵکدا تێناپەڕین.

١٠- ئەگـەر پێڵاوەکانمـان پـیس بـوو پـێش چـونە نـاو مزگـەوت پـاکی دەکەینەوە.

# دوعای هاتنە دەرەوە لە مزگەوت

**بسم الله والسلام على رسول الله اللهم اغفر لي ذنوبي وافتح لي أبواب فضلك(١٩).**

واتە: بەناوی خواوە، سەڵات وسەلام لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ، خوایە لە تاوانەکانم خۆش بە، وە دەرگاکانی فەزڵ وچاکەی خۆتم لێ بکەرەوە.

١- پێی چەپ پێش دەخەیت لە هاتنە دەرەوە لە مزگەوت.

٢- ئەو دوعایەی سەرەوە دەخوێنیت لەکاتی هاتنە دەرەوە لە مزگەوت.

٣- چاوەڕوانی نوێژی داهاتوو دەبین.



(١٩) (صحيح الجامع الصغير: ٤٧١٦).

# ئادابی قوتابخانە

١- قوتابخانە جێگای فێر بوونی زانست وئەدەبە.

٢- پێش چوون بۆ قوتابخانە وانەکانم ئامادە دەکەم وئـەرکی سەرشـانم جێبەجێ دەکەم.

٣- بە جل وبەرگ وپۆشاکی خاوێنەوە دەچم بۆ قوتابخانە.

٤- قژم شانە دەکەم ونینۆکم دەکەم وپێڵاوەکانم بۆیاخ دەکەم.

٥- هەموو پێداویستییەکانم لەگەڵ خۆم دەبەم وهیچیان لـە بـیر ناکـەم (پەرتوك، دەفتەر، قەڵەم، لاستیك، قەڵەم دادەر، راستە.........).



٦- پارێزگاری لە پاك وخاوێنی پەرتوك ودەفتەرەکانم دەکەم.

٧- پارێزگاری لە شتومەك وکەرەستەکانی قوتابخانە دەکەم.

٨- مامۆستاو قوتابیانم خۆش دەوێت ورێزیان لێ دەگرم.

٩- لە پۆلدا بە بێ دەنگی دادەنیشم وگوێ لە مامۆستا دەگرم.

١٠- ئەگەر لەوانەکە تێنەگەیشتم ئەوا داوا لە مامۆستا دەکەم کە بۆم دووبارە بکاتەوە.

١١- ئەگەر مامۆستا پرسیاری کرد و وەڵامەکەم زانی بە بێ دەنگ دەست بەرز دەکەمەوەو چاوەڕێی مۆڵەتی مامۆستا دەبم.

١٢- لە کاتی تاقی کردنەوەدا باش دەخوێنم وخۆمی بۆ ئامادە دەکەم ویشت بەخوای گەورە پاشان بە خۆم دەبەستم .

١٣- نەتەماشای هاوڕێکانم دەکەم ونەرێگەش دەدەم ئەوان تەماشام بکەن.

١٤- پەنا بۆ قۆپی کردن (غەش) نابەم وهەرگیز بیری لێ ناکەمە.

١٥- ئەگە تاقیکردنەوەکەم لەلا قورس بوو ئەوا ئەم دوعایە دەخوێنم تا خوای گەورە بۆمی ئاسان بکات:

(اللهم لاسهل إلا ما جعلته سهلا وأنت تجعل الحزن إذا شئت سهلا)[٢٠].

واتە: ئەی خوای گەورە هیچ شتێك ئاسان نییە ئیللا مەگەر تۆ ئاسانی بکەیت، وەهەر تۆ ئەگەر ویستت لێ بێت شتە قورسەکان ئاسان دەکەیت.

١٦- لەکاتی پشودا لە گۆڕەپانی قوتابخانە ناچمە دەرەوە.

١٧- پارێزگاری لەنوێژ کردنم دەکەم ونایفەوتێنم ولەکاتی پشودا دەیکەم.

---

(٢٠) (سلسلة الأحاديث الصحيحة: ٢٨٨٦).

١٨- دەنگ بەرز ناكەمەوەو شەڕ لەگەڵ كەس ناكەم.

١٩- ئەگەر هەر گرفت وكێشەیەكم هەبوو لە قوتابخانە ئەوا رابەری پۆل ئاگادار دەكەمەوە تا بۆم چارەسەر بكات.

٢٠- لەكاتی دەرچوون لە قوتابخانە خۆم دوا ناخەم وبۆ شوێنی تر ناچم وراستەوخۆ دەگەڕێمەوە بۆماڵەوە.

# دوعای سوار بوونی ئۆتۆمبیل

**بسم الله، الحمد لله، سبحان الذي سخر لنا هذا وما كنا له مقرنين وإنا إلى ربنا لمنقلبون**[٢١].

**واتە: بە ناوی خواوە، حەمدو سوپاس بۆ خوای گەورە، پاك وبێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە ئەمەی بۆ ژێر بار کردین،**

**١- لەکاتی سوار بوونی هەر ئاژەڵێك یان ئۆتۆمبیل یان فڕۆکە یان شەمەندەفەر یان کەشتی............ ئەم دوعایەی سەرەوە دەخوێنین.**

**٢- سوپاس کردنی خوای گەورە لەسەر ئەم بەخششە.**

**٣- ئەگەر بەسەر بەرزاییدا رۆیشتین (الله أكبر) دەکەین.**

**٤- ئەگەر بەسەر نزماییدا رۆیشتین (سبحان الله) دەکەین.**



(٢١) (صحيح سنن الترمذي: ٣٤٤٦).

# ئادابی چەژنەکان

## تقبل الله منا ومنك[٢٢]

واتە: خوای گەورە لە ئێمەو تۆیشی قەبوڵ بکات.

١–سەرەڕای هەینی موسڵمانان دوو چەژنی تریشیان هەیە کە بریتین لە چەژنی رەمەزان وچەژنی قوربان.

٢– چەژنی رەمەزان لە پاش بەرۆژوو بوونی مانگی رەمەزانە.

٣– چەژنی قوربان لە پاش ئەنجامدانی حەجیماڵی خوایە.

٤– چەژنی رەمەزان دەکەوێتە یەکی شەوالەوە.

٥– چەژنی قوربان دەکەوێتە دەی (ذي الحجة) ەوە.

٦– جوانترین پۆشاك وجل وبەرگمان لەبەر دەکەین.

٧– دەربڕینی خۆشی وشادی بە بۆنەی چەژنەوە.

٨– سەردانی کردنی خزم وکەس وکار ودراوسێ وهاوڕێیانمان.

٩– یارمەتی دانی هەژارو نەداران.

١٠– لە کاتی بەیەکتر گەیشتن لە چەژندا ئەو دوعایەی سەرەوە بەیەکتر دەڵێین، پاشان پیرۆزبایی لەیەکتر دەکەین.

١١– زۆر خۆری وزیادە مەسرەفی ناکەین.

١٢– خۆشوشتن پێش چوون بۆ نوێژی چەژن.

١٣– نوێژی چەژن لە مزگەوت ئەنجام دەدەین[٢٣].

---

(٢٢) (تمام المنة: ص٣٥٤).

(٢٣) بؤ زياتر شارةزا بوون لة حوكمةكانى ضةذن بطةرِيَرةوة بؤ ثةرتوكة وةرطيَرِاوةكةم (حوكمةكانى هةردوو

# سەرسام بوون بە شتێكی جوان

﴿ما شاء الله لا قوة إلا بالله﴾ [الكهف: ٣٩].

واتە: ئەوەی خوای گەورە ویستی لێ بێت هەر ئەوە دەبێت، وە هیچ هێزو توانایەك نییە بۆ هیچ كەس مەگەر بە هۆی خواوە نەبێت.

١- لەكاتی بینین وسەرسام بوون بە شتێكی جوان ئەو دوعایەی سەرەوە دەخوێنین.

٢- حەسودی پێ نابەین ودوعای خێرو بەرەكەت بۆ خاوەنەكەی دەكەین.

٣- رازی دەبین بەو بەشەی كە خوای گەورە پێی بەخشیوین.

٤- تەماشای خەڵكانی خوار خۆمان دەكەین نەك سەرووی خۆمان.

---

ضةذن لة سوننةتی ثاككراودا).

# لە كاتی ڕوودانی شتێك كە پێت خۆش بێت

**الحمد لله الذي بنعمته تتم الصالحات[٢٤].**

**واتە: حەمدو سوپاس بۆ خوای گەورە كە بە هۆی بەخششەكانی ئەوەوە كارە چاكەكان تەواو دەبن.**

**١- سوپاس كردنی خوای گەورە لەسەر بەخششەكانی.**

**٢- هەموو كارەكان بە بێ یارمەتی خوای گەورە تەواو نابن.**



(٢٤) (صحيح الجامع الصغير: ٤٦٤٠).

# لە كاتی ڕوودانی شتێك كە حەزی پێ ناكەیت

الحمد لله على كل حال(٢٥).

واتە: حەمدو سوپاس بۆ خوای گەورە لەسەر هەموو حاڵەتەكان.

١- هەموو شتێك بە قەزاو قەدەری خوای گەورە ڕوو دەدات.

٢- ڕازی بوون بە قەزاو قەدەری خوای گەورە.

٣- لەوانە شتێك ڕوو بدات وپێمان ناخۆش بێت بەڵام خێری تێدا بێت بۆمان.



(٢٥) (صحيح الجامع الصغير: ٤٦٤٠).

# لە كاتی بیستنی هەورە بروسكە

سبحان الذي يسبح الرعد بحمده والملائكة من خيفته[٢٦].

واتە: پاك وبێگەردی لە هەموو كەم وكورِییەك بۆ ئەو خوایەی كە هەورە بروسكە بەپاكی رادەگرێت وهەروەها فریشتەیش لێی دەترسێت.



(٢٦) (صحيح الأدب المفرد: ٧٢٣).

## لەكاتی هەڵكردنی بادا

اللهم إني أسألك خيرها وخير ما فيها وخير ما أرسلت به وأعوذ بك من شرها وشر ما فيها وشر ما أرسلت به(٢٧).

واتە: خوایە من داوای خێرو چاكەی ئەم بایەت لێ دەكەم، وە چ خێرو چاكەیەكی تێدایە، وە چ خێروچاكەیەكت پێدا ناردووە، وەپەنا دەگرم بەتۆ لەشەڕو خراپەی ئەم بایە، وە چ شەڕو خراپەیەكی تێدایە، وەچ شەڕو خراپەیەكی پێ نێردراوە.

## لە كاتی بێ بارانیدا

اللهم أغثنا اللهم أغثنا اللهم أغثنا(٢٨).

واتە: خوایە فریامان بكەوەو بارانمان بۆ ببارێنە.

## لە كاتی باران بارینـدا

اللهم صيبا نافعا(٢٩).

واتە: خوایە بارانەكە بارانێكی سودبەخش بێت.

(٢٧) (متفق عليه، وانظر: مشكاة المصابيح: ١٥١٣).

(٢٨) (البخاري: ١/٢٢٤، ومسلم: ٢/٦١٣).

(٢٩) (صحيح الجامع الصغير: ٤٧٢٥).

# لە پاش باران بارین

مطرنا بفضل الله ورحمته[٣٠].

واتە: بارانمان بۆ بارێنرا بـە هـۆی فـەزڵ وچـاكەو رەحـم وسـۆزی خـوای گەورەوە.

١- باران بارین هۆكارە بۆ ئاوەدان كردنەوەی وڵات.

٢- باران بارین سودی هەیە بۆ رووەك وئاژەڵ وزەوی و مرۆڤـ.

٣- لـەكاتی هـەموو ناخۆشـییەك تـەنها هانـا بـۆ خـوای گـەورە دەبـەین وداوای فریا كەوتن ویارمەتی لەو دەكەین.

٤- تاوان وسەرپێچی هۆكارە بۆ بێ بارانی.

٥- خێرو زەكات وصەدەقەو بەخشین لـەپێناوی خـوای گـەورە هۆكـارە بۆ باران بارین.

٦- لە كاتی باران باریندا دوعا دەكەین، چونكە دوعا كردن قەبوڵە .

٧- باران بارین فەزڵ وچاكەو رەحمەتی خوای گەورەیە.



(٣٠) (صحيح الجامع الصغير: ٧٠٢٨).

# لە كاتی بینینی مانگ

الله أكبر اللهم أهله علينا بالأمن والإيمان والسلامة والإسلام والتوفيق لما تحب وترضى ربنا وربك الله[٣١].

واتە: خوای گەورە لە هەموو كەس وشتێك گەورەترە، خوایە بیگەڕێنیتەوە سەرمان بە هێمنی وئارامی وئیمان وپارێزراوی وئیسلام ویارمەتیدان بۆ هەرشتێك كە خۆت پێت خۆشەو لێی رازیت، ئەی مانگ پەروەردگاری ئێمەو تۆیش هەر الله یە.



(٣١) (صحيح الكلم الطيب، حديث رقم: ١٦٢).

## لە کاتی بیستنی وەڕینی سەگ وزەڕینی کەر بەشەو

أعوذ بالله من الشيطان الرجيم[٣٢].

واتە: پەنا دەگرم بە خوای گەورە لە شەیتانی رەجم کراو.

## لە کاتی بیستنی دەنگی کەڵەشێر

اللهم إني أسألك من فضلك[٣٣].

واتە: خوایە من داوای فەزڵ وچاکەی تۆ دەکەم.



تەواو بووم لە کۆکردنەوەو ئامادەکردنی ئەم نامیلکە بەسودە لە رۆژی یەك شەممە بەرواری ٢٩/جمادى الأولى ١٤٣٠ك بەرامبەر ٢٤/ ٥/ ٢٠٠٨ز

(٣٢) (أبو داود: ٤/ ٣٢٧، وأحمد: ٣/٣٠٦، وصححه الألباني في: صحيح أبي داود: ٣/٩٦١).

(٣٣) (البخاري مع الفتح: ٦/٣٥٠، ومسلم: ٤/٢٠٩٢).

والحمد لله الذي بنعمته تتم الصالحات